بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

٢٠١٨

# كوردو زەردەشت و ئاڤێستا

لە زەنجیرە چریکەکانی :

محمد عزیزی

١٦

چریکەی : شازدەیەم

# پێڕستەکان

# پێشەکی

ماوەیەکە لێرەو لەوێ دەبینین و دەبیسین بانگەشەو ڕێکلام بۆ ئایینی زەردەشتی دەکرێت . گوایە ئەم ئایینە ئایینی کوردەو زردەشت پەیامبەرێکی کورد بووەو ئاڤێستاش کتێبێکی ئاسمانی کوردییە . بۆ ئەم مەبەستە حیزبە عەلمانیەکانی کوردی هەوڵێکی جیدی دەدەن و بە هەموو شێوەیەک یارمەتیدەرو هاوکاری ئەوەن ئەم بانگەوازە بە هەموو کوردێک بگات و بگەڕێنەوەو سەر ئەو ئایینە . دواتر چەندین تۆڕو باندو دەستەو کەسیان داناوەو بەشی ماڵیان بۆ تەرخان کردوون لەم بارەیەوە هەوڵی جیدی بدەن و کاری پێویست بۆ ئەم مەبەستە بکەن و ئێستاش بەردەوام لە هەوڵدانن....

ئێمەی موسڵمان لە بنج و بنچینەی ئەم پیلانەو سەرجەم پیلانە شکستخواردووەکانی ڕابوردوو ئێستایان ئاگادارین و دەزانین ئەمە دەستێکی دزێوو خائین و ناپاک لە پشت ئەم پرسەیەو دەیانەوێت هەندێک کوردی سادەو ساویلکە بگەوجێنن کە گوایە ئایینی کورد ، ئایینی زەردەشت بووەو دەبێت بگەڕێینەوە سەر ئەو ئایینە و دەبێت کورد ببێتەوە بە زەردەشتی و بگەڕێتەوە سەر ئەو ئایینە.

وەک هەموو لایەک ئاگادارن سەرجەم هەوڵ و پیلانەکانیان بە ناوی کوردایەتی و جوولانی حەماسەی کوردایەتی و نەتەوەپەرەستی و ڕەگەزپەرەستی و ناسیۆنالیستی ڕەق و ڕەش و وشکی کوردایەتی خەڵک هان دەدەن و خەڵک لە خشتە دەبن ، هەر بۆیە لەم بارەیەوە هەندێک جەماوەریان لە دەوری خۆیان کۆ کردووەتەوەو وەک کۆیلە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بە کاریان دەبن و بارکێشیان پێ دەکەن...

به ناوی گەڕاندنەوە بۆ سەر ئایینی زەردەشتی کە ئایینی کوردە دەیانەوێت بە زۆرە ملی ، ملی مێژوو بشکێنن و مێژوو چەواشەو ساختە بکەن و زەردەشت بکەن بە خەڵکی ورمێ و ئورومیە لە باکوری کوردوستانی ئێران . بە ناوی جوڵانی هەستی نەتەوایەتییەوە دەیانەوێت نەتەوەی کوردی موسڵمان لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەڵبەگێڕننەوە . ئەوان باش دەزانن نەتەوەی کورد هەندێک ساوێلکەو نەزانی هەیەو بە ئاسانی بەم ناوانەوە ڕاو دەکرێن و دەگیرێن . هەر بۆیە بۆ سەرجەم ئامانجە بۆگەنەکانیان شوعاری کوردو کوردوستان و کوردایەتی بە کار دەبەن . ئەمەش تەنیا وەک کالایەکی بازارگانی . نەک دڵسۆزی و خۆشەویستی بۆ کوردو کوردوستان و نەتەوە....

ئەوان لە ژێر ناوی ئیسلام دینی عەرەبەو موحەممەد صلی اللە علیە و سلم عەربییە و نابێت هیچ کوردێکی شۆڕشگێرو نیشتیمان پەروەر شوێنی بێگانە بکەوێت . ئەم پرسانە دەوروژێنن و دەجوڵێنن . لە بەر ئەوە وەک ووتمان سەرنجی هەندێک گەمژەو نەزان ڕابکێشن . ئەوەی جێگای داخ و پەژارەیە خەڵکەکەش ئەو ئاستەی نییە بە جوانی بیر بکاتەوەو لە ڕاستییەکان تێبگەن و لێیان بپرسین :

ئەگەر ئیسلام ئایینی عەرەب بێت و قورئان بۆ عەرەب هاتبێت و نابێت ئێمەی کورد شوێنی بێگانەو بیرو باوەرو ئایدیای بێگانە بکەوین . ئەی عەلمانییەت کەی هی کوردەو کەی پویوەندی بە کوردەوە هەیە؟

لە کام شارو لادێی و دەشتی کوردی عەلمانییەت لە دایک بو؟

ئەی دیمۆکراسی و سۆسیالیستی و لیبرالی و ڕادیکالی و فێمێنیزمی و جەندەری کەی پەیوەندی بە نەتەوەی کوردەوە هەیەو کەی بیرو باوەڕی نەتەوەی کورد بووەو هەڵقوڵاوی ڕەسەنی کوردو نەتەوەی کورد بووە؟

ئەی ئەگەر بەرزو بالاترین مرۆڤ وەک موحەممەد صلی اللە علیە و سلم بە ئێمەی کورد بێگانە بێت و نابێت شوێنی بکەوین . ئەی مارکس و لینین و داروین فرۆید چی ئێمەی کوردن . کام ژیری دەڵێت : موحەممەد بە

ئـێمه غـەریـب و غـەواره بێـت و لینـین و داروێـن مـامۆ و خـالۆی ئـێمەی کـورد بێت؟

کـام ژیـری قەبـوڵی دەکـات بـۆ ئـێمەی موسـڵمانی کـورد عەیـبەو تێنەگەیشـتن بێـت کاتێـک دەڵێـین نەوەی ئـادەم و مـرۆڤین ، بە دوا کەوتوومـان دەزانـن ، بەڵام بـۆ ئەوان فـول زانسـتی بێـت کە لە سـەدەی لەت کردنـی ئەتۆمـدا دەڵـێن : ئـێمەی لە مێکـوتە سـەرەو کـرم و مێـروو قورپـاقە تەتەورمان کردووەو نەوەی مەیمون و عەنتەرو شامپازین؟!!

ئـاخر ئەمە کەی ژیـری و لـۆژیکە لە ئیسـلامێکی مەزن لە ئـایینێکی ناسـراوی جیهـانی و ڕاسـت و دروسـت هەڵبگەڕێـتەوە بـۆ سـەر ئـایینێکی ئێکسـپایەر کە زۆرینـەی کـورد نازانیـت چییـەو چـۆنەو هەر خـودی مولحیـدو عەلمانییەکـان نـازانن کۆدەکـانی ئاڤێسـتا چییـەو چـۆنەو بە چـی بیشکێنن...؟

ئایـا ئەمە ئینسـافە لە قورئـانێکی لیـوان لێـوو فـوک زانسـتی کە نـزیکەی هەزار ئـایەتی زانسـتی هەمەلایەنەی تێـدایە ، هەڵبگەڕێـنەوە ، سـەر ئاڤێسـتایەک کە لە سـەد کـورد نەوەدونـۆی نازانێـت چییـەو چـۆنەو بە چە زمـانێکەو چەنـد بەشـەو چەنـد دەقەو لیـوان لیـوە لە دژو دژوارو دەقـی خوێناوی و کۆمێدیاو گاڵتەجاڕی و خورافات؟!

ئـاخر ئەمە کەی پیـاوەتی و کـوردایەتییە ، لە پێغەمبەرێکـی نـاوداری جیهـانی وەک مـوحەممەد صـلی الـلە علـیە و سـلم هەڵبگەڕێـنەوەو شـوێنی کەسـێکی وەک زەردەشـت بکەوێـن کە کچـی خـۆی خواسـتووە و لە سـەدا نەوەو نـۆ کـورد نایناسـێت و نازانێـت چـی و چـۆن بـووەو بە چە زمانێـک قسەی کردووەو خەڵکی کوێیە؟!!!

ئەمە کام کوردایەتی و دڵسۆزییە بۆ نەتەوەی کوردی موسڵمان؟

ئەمە لـوتکەی دوژمنـایەتی ئەم نەتەوە موسـڵمانەیە بەڵام بە نـاوی دڵسۆزییەوە...!

ئەمە تێکۆشان و خەباتە بۆ کافر کردنی نەتەوەیەک بە ناوی دڵسۆزی و نەتەوایەتییەوە...!

ئاخر ئەمە نە زانستەو نە ئینساف ، نە دڵسۆزییەو نە مرۆڤایەتی....!!

بە پشتیوانی اللە ئێمەی کوردی موسڵمان لێرەدا بە ڕاشکاوی دەیسەلمێنین : نە زەردەشت کوردەو نە بۆ کورد هاتووەو نە ئاڤێستاش پەیامی ئاسمانیەو نە زەردەشت پێغەمبەر بووەو نە کورد بووەو نە بۆ کورد هاتووە ،

دواتر هەر بە بەڵگەو دەقەکانی ئاڤێستا دەیسەلمێنین کە ، ئاڤێستا کتێبێکە مرۆڤ شەرم دەکات بیخوێنێتەوەو فرۆشتنی خێزان و زینای باوک لە گەڵ کچ و برا لە گەڵ خوشکی تێدایەو تەنانەت خودی زەردەشت زەواجی لە گەڵ کچی خۆی کردووەو چەندین دەقی خوێناوی و خورافی تێدایەو لێوان لیوە لە شتی قێزەون و سەیرو سەمەرە ، بە کورتی ئەوەی تۆزقاڵێک ئەخلاق و شەرمی هەبێت ئاڤێستا بە کتێبی خۆی نازانێت و ئەوانەش بەو ناوو ناتۆرانەوە گەوجێنراون دڵنیاین هیچ لە زەردەشت و ئاڤێستا نازانن و تەنیاو تەنیا بە حەماسەی نەتەوە پەرەستی گەمژێنراون ، ئەوەی جێگای خۆشحاڵی ئێمەی موسڵمانە شوێنکەوتووانی زەردەشت و ئاڤێستا لە ئێستادا ئەو کەسانەن کە فەشەلی ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و خێزانیان هێناوەو دەتوانین بڵێن :کەسە نزم و پەست و دۆڕاوەکانن و بە دەگمەن بە دی دەکرێن و زۆر کەمن و شەرم دەکەن خۆیان ئاشکرا بکەن.....

ئەگەر چاوێک بخشێنین بە مێژوودا دەتوانین بڵێن کورد لە ژێر یاساکانی ئەو ئایینەدا پیسترین چەوسانەوەی بینیووەو ستەمی لێکراوە لە سەردەمی <کیسرادا> ، ئەوەی سەردانی مۆزەخانەکانی تارانی کردبێت لە سەر تابلۆکان ئەم ڕاستیە مێژوویانە دەبینێت بە جوانی و زانیاری لەم بارەیەوە دەست دەکەوێت ، کەواتە دڵنیاتان دەکەین هیچ کوردێک بەڵگەی

ڕاســـتی لە ســـەر ئـــایینی زەردەشـــتی و ئاڤێســـتا نـــیەو هەر هەموویـــان دوای وەهم و قسـەی دەم بە دەم و بێ بنەما کـەوتوون.

ئەوەی مەبەسـتی ئـێمە دەبێـت هەمـوو تـاکێکـی کـوردی موسـڵمانی ئاگـاداری ئەم حەمـلە بـۆگەنەو ژەهـراوییە بێـت و دەوری کـاریگەری هەبێـت بـۆ لە قـاو دان و پـوچەڵکردنەوەی ئەم پـیلانە . ئـاواتی لە مێـژینەی ئەوانە بە هەر جـۆرو بەهـایەک بـووە ئەم نەتەوە موسـڵمانە کـافرو بـێ دیـن بـکەن . ئەمەش مەحـاڵەو لە مێـژوودا دەیـان هەوڵـی لەم شـێوەیان داوەو شکسـتیان خـواردووە . بە پشـتیوانی الـلە لەم هەوڵە نەگریسەیەشـدا شکسـتیان پـێ دەدەیـن و ڕێسـەکەیان دەکەیـنەوە بە خـوری و لە سـەرجەم هەوڵەکانیـان شکسـتیان پـێ دەدەیـن و ئـیفلاس و ڕەنـجەڕۆی دونیـاو قیامەتیـان دەکەیـن و هەرچـی لەو پێنـاوە سـەرف دەکەن دەبێـت بە حەسـرەت و خەم بە سـەر دڵیـانەوە . وەک خـوای گـەورە دەفەرموویێت:

[إِنَّ الَّـذِينَ كَفَـرُوا يُنْفِقُـونَ أَمْـوالَهُمْ لِيَصُـدُّوا عَـنْ سَـبِيلِ اللَّهِ فَسَـيُنْفِقُونَها ثُـمَّ تَكُـونُ عَلَـيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ]الانفال:٣٦

**واتە: بێگومان ئەوانەی بێ باوەڕن، ماڵ و سـامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی بەشـێنەیی بەربەست دانێن و ڕێگری بکەن لە بەردەم ئاین و ڕێبازی خوادا، جا ماڵ و سامانیان لە ئایندەدا بۆ ئەو مەبەسـتە خەرج دەکەن! پاشـان دەبێتە پەشـیمانی و داخ و حەسـرەت لەسـەریان، لەدوایدا شـکسـت دەهێنن، بێگومان ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون بۆ دۆزەخ کۆ دەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن.**

**(محمد عزیزی)**

# لە دایك بوونی زەردەشت و كورد نەبوونی

لێرەدا چەند بەڵگەیەک لەو بارەیەوە دێنینەوە لە سـەر سـاڵی لە دایک بوونی زەردەشـت:*١*

- یەکەم : بە پێی کتێبی < اردوایراف نامە >و بۆچونی زۆرێک لە مێژوونوسەکوردو هەندێک لە ئێرانییەکان بە 660 ساڵ پێش زاینیان دیاری کردووە.
- دووەم : ماتماتیک زان و ئەستێرە ناسی بە ناوبانگی گریکی ئۆدوکسۆس کنیدوس بە 6000 ساڵ پێش ئەفلاتۆن دایناوە.
- سێیەم : هەندێکیتر بە 1200 ساڵ پێش زاین لە قەڵەمیان داوە.
- چوارەم : بەشێکی تریش لە توێژەران بە سەدەی 5 پێش زاینیان داناوە.
- پێنجەم : بەشێکی تریش بە 1000 ساڵ پێش زاین باسیان کردووە.
- شەشەم : بەڵام ئەو ڕایەی کە زەردەشتیەکان خۆیان قەناعەتیان پێیەتی و لە نوسراوەکانیان وەک کۆرشی نیکنام لە ئایینی هەڵبژاردەو مامۆستا جلیل عباسی لە دەلاقەیەکی نوێ ڕوو بە مێژووی کۆن و زەردەشتیەکانی ئێران باوەڕیان پێیەتی ئەوەیە کە دەڵێت:

زەردەشت لە ڕۆژی خورداد واتە 6 ی فەروەردینی ساڵی 1768 پێش زاین لە دایک بووە.

مێژوو نووسانی فارس لەم بارەیەوە چەند ڕایەکیان هەیە:

زەردەشت لە ئازەبایجان خاکی ئاگرین لە دایک بووە نزیکەی 6000 هەزار ساڵ بەر لە هاتنی عیسی سەلامی خوای لێ بێت ، هەندێکیتر دەڵێن : زەردەشت لە ڕۆژهەڵاتی ئەفغانستان لە دایک بووەو نزیکەی 7000ساڵ پێش لە هاتنی عیسی ، لە سەرجەم بەڵگەنامەو سەرچاوە مێژوویەکاندا باسی ئەوە نەکراوە کە زەردەشت کورد بووەو بۆ کورد هاتووە ، تەنانەت ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەین

زەردەشت زۆر دور بووە لە جوگرافیای بابلیەکان ، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە زەردەشت نە کورد بووەو نە فرێ بە کورد بوون و جوگرافیای کوردوستانەوە هەیە......!!

ئازیزانم زۆربەی نوسەرە جیهانی و کوردی و ئێرانیەکان ڕای خۆیان هەیە لە سەر جێگای لە دایک بوونی زەردەشت ، ئێمە هەندێک لەو جێگانە لێرەدا دەنووسین:

➢ڕەی(نزیک تارانی ئێستا)

➢ئورومیە (ورمێ)

➢ئازەربایەنجان

➢شیز و تەختی سولەیمان

➢ما وراء الانهار (ئۆزبەگتان و تاجیکستان=تورانی کۆن)

➢خواریزم (ناوچەیەکە لە نێوان دەریاچەی ئۆڕاڵ و ما وراء الانهار)

➢بەڵخ (لە ئەفغانستانی ئەمڕۆیە)

➢سیستان و بەلوجستان

➢ئامل (شارۆچکەیەکە لە پارێزگای مازیدەرانی سەر دەریای خەزەر )

➢تورکمانستان

هۆکاری دروستبوونی ئەم ناکۆکیە چیە لە سەر لە دایک بوونی زەردەشت؟

هۆکارەکە تەفسیر و لێکدانەوە جیاوازەکانە بۆ > ایران ویج <

ایران ویج کوێیە؟

ایـران ویـج کـه بـه ئاڤێسـتایی پێـی وتـراوە اریـن وئـیجە بە فارسـی ئێسـتاش ایـران ویـج وە سـغدیش اریانـا وئـیجە بە ئەشـکانیش اریـان ویجـن بە کـوردیش ئاریان واچ

ئەم نـاوچەیە بە گرنگتـرین نـاوچەی ئێرانـی کـۆن دانـراوەو لە ئاڤێسـتادا ڤـارگەردی یەکـەمـی ڤـەنـد ڤـیداد بەنـدی 3 و 4 دەڵێـت : باشـترین شـوێنێک کە ئاهورامەزدا دروسـتی کردبێت > ئاریان واچە >

لە کـاتێکـدا نازانرێـت و بەڵگـەیەکـی دڵنیاکـەرەویـان نـیـە بـۆ زانینـی شـوێنی ڕاسـتی > ئاریان واچ >

هنـدێک گـومانیـان وایە کە ئەم نـاوچەیە لە نێـوان دەریـاچەی ئـۆڕاڵ و ئۆزبەگسـتان و خـواریزم تـاکو ئازەربایـنجـان لەوێشـەوە تـا باشـور یـان بـاکوری خۆرهەڵاتی ئەفغانستان دەگرێتەوە..............

هەنـدێکیش بە نـاوچەی سـغدیان دانـاوە کە ئەودیـوی ڕوبـاری سـەیحون دەگرێتەوە و دەچێتە ناو وڵاتی چینیشەوە..........

وە هەندێکیتریش بە ناوەڕاستی وڵاتی ئێرانی کۆن دایان ناوە....

وە ڕایەکـی تـریش لە سـەر ئەوەیە کە نـاوچەی ئەترۆپاتکـان یـا زەوی مـاد یـا ئازەربایجان دانراوە

ئـازیزانم بـۆ ئەوەی ڕاسـتیەکانتان بـۆ دەرکـەوێت ئـێمە بەراوردێـک دەکەیـن بـۆ ئەو خالانەی ئاڤێستا لەم بارەیەوە باسی کردووە...

ئاڤێسـتا بـاس لەوە دەکـات زەردەشـت لە نزیـک ڕووبـاری دائیتـی لە دایـک بـووە کە نـاوی ئەم ڕووبـارە لە ئاڤێسـتا یەشـتـی 5 ئابـان یەشـت بەنـدی 104 و چەنـد یەشـتێکی تـردا هـاتووە . هەنـدێک بە سـەیحونیان دانـاوە هەنـدێککیش بە جەیحـون هەنـدێکیش بە سـفید ڕوود دایاننـاوە . بەڵام ئاڤێستا دەڵێت زەردەشت  لە ڕاغە لە دایک بووە...

هەنـــدێک دەڵـــێن مەرەغەی خـــۆرهەڵاتی دەریـــاچەی ورمێـــیەو نـــاوچەیەکی تریشـــمان هەیە کە هەمـــان ســـیفاتەکانی مەراغەی هەیە کە بـــانی ڕخـــجە لە نێوان ئێران و ئەفغانســتان و پاکســتانی ئێـران کە ڕێـک ناوەڕاسـتی ئێرانـی کۆن دەکات ، بەڵام ئێمە وتمان < اریان واچ >

کەواتە ئێستا: < ئاریان واچ >و< ڕاغە >و< ڕووباری دائیتی >مان هەیە

زۆرێـک لە تـوێژەران تەنـانەت کوردەکـانیش لەوانە مامۆسـتا جلیـل عەبباسـی کە خۆشـــی زەردەشـــتییە لە کتێبەکەیـــدا بەنـــاوی :دەلاقەیەکـــی نـــوێ ڕوو بە مێژووی کـۆن دەڵێت :ئێران واچ ناوەڕاسـتی ئێران بووە

باشـــە گەر ئـــێمە ســـەرنج بـــدەین لە ڕخـــج ڕووبـــارێکی گـرنـگ بەرەو ڕووی دێـت کە هیرمەنـــدە کە لە بـــاکوری خـــۆرهەڵاتی ئەفغانســـتانەوە دێـــت و دەڕژێـــتە دەریاچەی هاموون !

بە جوانی سـەرەنج بدەن هەموو بەڵگەکان بەرەو ئەوە دەڕۆن:

ئاریان واچ = ناوەڕاسـتی ئێران

ڕاغە = ڕخج

دائیتی = هیرمەند

هەمـــوو ئەو بەڵـــگە عەقڵـــی و جـــوگرافی و زمـــانەوانی و ئاڤێســـتاییەکان بـــۆ ئەوە دەڕۆن کە زەردەشـــت لە بـــانی ڕخـــج نزیـــک کەنـــاری ڕووبـــاری هیرمەنـــد و دەریـــاچەی هـــاموونی زابولســـتان لە سیســـتان و بلۆجســـتان کە یەکێـک بـــووە لە گرنگتـــرین نـــاوچە ئێرانیەکـــان و تەیمـــوری لەنـگ لە یادەوەریەکانیـــدا دەڵێـت لە هەمـــوو ئێرانـــدا تـــاکە شـــوێنێک کە وشـــەی ئێرانـــی بەکارهێنابێـــت زابوولیەکـــان بـــوون . لەوێ لە دایـک بـــووە . کەواتە ئـــێمە دەبێـــت بە پێـــی دەق و واقیـــع بڕیـــار لە ســـەر شـــتەکان بـــدەین نەک لەســـەر عـــاتیفە و هەســـت و سۆزی وشک و ڕەشـی کـوردایەتی و مەبەسـت و ئامانجی ژەهراوی.

تەنانەت ئەو هۆزانەی داریوشی فارس بەر لە ١٦٠٠ ساڵ پێش زاین دابەشی کردن و کرانە زەردەشتی کوردی تێدا نیەو لە ئایینی پێشتی هەر هۆزێک کوردی تێدا نیە:

*پارتەکان لەخوراسان

*ماددەکان باکوری خۆرئاوای ئێران

*پارسەکان لەباشوری ئێران

*هیرکانیەکان لە استر اباد

*ئاریەکان لەکەنارەکانی ڕوباری هریرود

*درانگیان لە باکوری خۆرئاوای ئەفغانستان

*ئارخۆتیان لەکەناری ڕوباری هیرمند و قەندەهار

*باکتریان لە دامێنی باکوری هندوکش و کەنارەکانی ڕوبارس جەیحوون

*سغدیەکان لە کەنارەکانی ڕوباری سیحوون

*خوارزمیەکان لە خیووەی ئێران

*ساگارتیان لە زاگرۆسی خۆرهەڵات

*مرگیان لە کەناری ڕوباری مارگوس

*١* سەرچاوە : پەیجی < زەردەشتی لە نێوان ئاین و فلسفە و کورد و هیند و فارسدا> لەم پەیجەدا بەندە ئەدمینم

زەردەشت هەندێک ناو دێنێت لە ئاڤێستادا وەک < کاوی ، کرین ، ئۆی فیس > و باسی دەسەڵاتدارێکی زاڵم دەکات بە ناوی < چم سیدی هوشەگ > بووە ، ئەگەر لێی ورد بینەوە ئەم ناوانە دورن لەو ڕایانە کە دەڵێن زەردەشت کورد بووە ، ئەم ناوانە دەگەڕێنەوە سەر وەڵاتی ئەفغانستان.......

ناوی زەردەشت : <زاراشووەشترای کوڕی پورڤەشەسپە یان <پۆرشاسپا>کوڕی <پیتەرەسپی> کوڕی <ئەورڤەگەدەسپەی> کوڕی <هیچەدەسپەی> یان < سیتاما >ی کوڕی < بورشاسب > بووە ، ناوی دایکی : < دۆغدو یان دۆغدۆڤا یان دۆغدا > بووە ، کە بە واتای کچ بووە ، بنەماڵەکەی بە بنەماڵەی <سپەنتاما>یان<سپینتاما> یان <سپیتامیدس> ناسراو بوون ، خێزاکەی ناوی <هڤۆڤی>بووە کە کچی <جاماسبی> وەزیری <گۆشتاسب> بووە ، سێ کچ و سێ کوڕی بووە، کچەکانی بە ناوەکانی: <فرێنی و پۆرەجستا و ترتی> بوون و وە کوڕەکانیشی : <ڤاستار و ئورڤات نارا و پۆورە چیستا> بوون....

لێرەدا لەو کەس و لایەنانە دەپرسین کە بانگەشەی زەردەشتی و ئاڤێستا دەکەن و دەڵێن : ؟ تەنیا یەک بەڵگەمان بۆ بێنن لە سەر کورد بوونی ئەو ناوانەو بچێتەوە سەر زمانی کوردی ؟!!!

یان بۆچی بابە تاهیری هەمەدانی ئەو لەهجەیە شیعری پێ نووسیوە ، هەمان لەهجە نیە کە ئاڤێستای پێ نووسیوە؟

بۆچی و لە بەرچی؟!!

# ناوی زەردەشت و هەر دوو خوداکەی

مێـــژوو نووســـــان لەم بـــارەیەوە دوو ڕای جیاوازیـــان هەیەو دەڵـــێن : پـــێش **700** تـــا **1200** ســـاڵ پـــێش لە دایـــک بـــوونی عیســـی خەڵکـــی پاشـــگری ئـــاژەڵی ســـوود بەخشـــیان بـــۆ نـــاو دانـــاوەو بە کـــار بـــردووە ، ســـەرەتا نـــاوی زەردەشـــت > زەرد وشـــتر > بـــووە ، تەنـــانەت هەر ئێســـتاش نـــاوی زەردەشـــت لە ئێـــران بە > زەرد توشت > دەبرێت......

ئەم > زاراشووەشـــترا = زەرد وشـــتر ، یـــان زەرد توشـــت >ە لە ئۆزباکســـتان لە دایـــک بـــووەو هەر لەوێ خـــۆی بانگەشـــەی پێغەبەرایەتـــی کـــردووەو نە کـــوردەو نە بـــۆ کـــورد هـــاتووە ، لە ئاڤێســـتا هەنـــدێک شـــت باســـکراوە کە دەیســـەلمێنێت : نە زەرد توشـــت کـــورد بـــووەو نە پێغەمـــبەرو نێـــردراوی خـــوا بووە وەک : دەڵێت دوو خودا هەیە

☜⊖ یەکەم : ئـــاهورا مەزدان ، یـــان ئـــاهورمزدا خـــودای چـــاکەو بە دیهێـــنەری گەردوون و ڕووناکـی ئاسمانەکانە

☜⊖ دووەم : ئەهـــریمەن خـــودای خـــراپە ، یـــان پـــیس و هێـــزی پـــیس و خـــودای تاریکـی و سەرچاوەی شەڕ

ئەمەش دژو موخـــالیفی ســـەرجەم پێغەمـــبەران و پەیـــامە ئاســـمانیەکانە کە دوو خـــودا بـــوونی هەبێـــت ، واتە لە ســـەرجەم پەیـــامە ئاســـمانیەکان تەنیـــا یەک خـــودا بـــوونی هەیەو باســـی یەک خـــودا دەکەن ، مەعقـــول نـــیە تەنیـــا ئاڤێستاو زەرد وشتر باسی دوو خوداو بوونی دوو خودا بکەن؟!!!

زەردەشـــت زۆر شـــتی ســـەیرو ســـەمەرەی هەیەو ئەوەی باســـی دەکـــات دژی ســـەرجەم پەیـــامە ئاســـمانی و پەیـــامبەرانە ، ئەو پێـــی وایە خـــودا بـــریتیە لە تیشـــک و ڕوونـــاکی ، هەر بـــۆیە ئـــاگر زۆر پیـــرۆز بـــووە لای زەردەشـــت ، تەنـــانەت لە کـــاتی ئـــاگر کـــردنەوە پەڕۆیـــان بە ســـەر دەم و لوتیـــان بەســـتووە ، لە بەر ئەوە بە بـــڕوای ئەوان مـــرۆڤ پیســـەو نابێـــت هەناســـەی بەر ئـــاگر بکەوێـــت و

ئــــاگرەکە پـــیس بکـــات ، بە کـــورتی زەردەشـــــت و زەردەشـــتیەکان ئاگریـــان پەرەســـــتووەو ئـــاگر پەرەســـــت بـــوون ، هەر بـــۆیە ئێســـــتاش ئەوانەی باســـــی زەردەشـــــتی دەکەن موشـــــتاقی ئـــاگرو ئـــاگر کـــــردنەوەو هەڵپەڕکـــێن بە دەوری ئاگردا ، لە بەر ئەوە ئاگر لای ئەوان پیرۆزەو تەوافی ئاگرەکە دەکەن....

مەگەر نـــابینن عەلمانیەکـــانی کـــورد چـــۆن بە دەوری ئـــاگردا ســـــەما دەکەن ، ئەمە بـــــۆ ئەوە دەگەڕێـــــتەوە کە نیکـــــۆتینی زەردەشـــــتیان تێــــدایەو وەک سیکۆتین بە دڵ و دەروونیانەوە چەسپیوە....!!

یـــان زەردەشـــــت و زەردەشـــتیەکان کاتێـــک کەســـێک بمـــردایە نەیاندەناشـــــت ، لە ســــــەر بینـــــا ، یـــان بـــــورج و بەرزایـــــیەک دایـــان دەنـــا ، تـــاکو باڵنـــــدەکان دەیـــانخواردو دواتـــر ئێســـــقانەکانیان دەخســــــتە شــــوێنێک ، لە بەر ئەوە ئەوان باوەڕیـــان وابـــوو کە مـــرۆڤ پیســـــەو نابێـــت بخـــرێتە نـــاو خـــاکەوە ، کەواتە دەبێـــت ئەوانەی بانگەشــــــەی زەردەشـــــتی دەکەن مردووەکانیـــــان نەنێژن....ئەگینــــا درۆ دەکەن و زەردەشـتی نین....!!!

# ئاڤێستا

ئاڤێستا له: <ئا ڤێد تا> پێکهاتووه که واتای بناغه و سەرەتا دەگەیەنێت و زۆر له شێوازی <ڤێد و یاجۆر ڤید و ئەسراڤاڤێده> دەچێت و وا گومان دەکرێت له ناوی <ڤەند ڤیداد> له: <ڕێگ ڤێد> وەرگیرابێت و ناوی: <یەسنا> و <یەشتەکانیش> له: <یاجۆر ڤێدەوە> وەرگیرابێت...........

ئازیزانم ئایا ئەم ناوانە تام و بۆن و ڕەنگی کوردی و کوردبوونیان لی دێت؟

ئایا ئەم ناوانە تەنانەت لە ناوی فارسی دەچێت؟

کەواتە ئەم ناوانە لە هیندوستان بە کار دێن و ناوی هیندین و هەموو شێوازەکانی ئاڤێستا لە کتێبی هیندۆوە ، واتە ڤێدەوە وەگیراوەو زمانەکەشی زۆر نزیکە لە سانسکریتیەوەو وەک دوو لەهجەی یەک زمان وان ، ئەگەر فەلسەفەو بیروباوەڕو وتەکانی زەردەشت ، وەک فەیلەسوفێک تەماشا بکەین ئەوە لە هندی و خۆرهەڵاتی دەچێت ....

لە دەقی **13** ڤارگەد و بەندی ـ**1** و **2** و **3** و **4** ی ڤەند ڤێداد دا دەڵێت:

ئەوە چ بوونەوەرێکە لە نیوەشەو تا بەیانیەکەی دێتە دەرەوە بۆ کوشتنی هەزاران بوونەوەری خراپەکار ؟ ئاهورامەزدا وەڵامی دایەوە :ئەو زیندەوەرە فنهابارا یاخود سەگی دەریایە و هەرکەسێک سەگی دەریا بکوژێت ئەوە لەعنەتی ڕۆحەکەی لەنەوەی داهاتووی دەگەڕێتەوە ئەگەر ئەم نەوانە بەهۆی ئەم کارەی باپیرە گەورەیانەوە کەفارەتی گوناهەکانیان نەکەن بەرامبەر سراوش و ئەوکەسەی ئەم کارەشی ئەنجامداوە **1000** قامچی ئەسپی لێدەدرێت کە گوێڕایەڵی دەکات قامچییەکان.

لێرەدا ئێمە باسی ئەم یاساو هەراو هوریایە ناکەین و بە مەهزەلەی دەزانین و تەنیا یەک پرسیار دەکەین ئایا سەگی دەریا لە کوردستان هەیە؟

ئاڤێستا : لای زەردەشتیەکان کتێبێکی پیرۆزەو دەڵێن بە زمانی هەورامی نوسراوەو زمانی کوردیە ، بەڵام هیچ بەڵگەیەکیان لە سەر قسەکانیان نیەو تەنیا دەم بە دەم هاتووەو هیچ سەرچاوەیەکیان لەو بارەیەوە نیە کە لەو کاتەدا زمانی کوردی یان هەورامی هەبووبێت . تا ئەو جێگایە ئێمە شارەزا بین لەو کاتەدا زمانی سنکریستی هەبووە کە ڤیدای هیندۆسەکانی هیندستانی پێ نوسراوەتەوە بۆیە هەتا ئێستاش ئەگەر یەکێک بیەوێت ببێت بە قەشە یان ئیمامی زەردەشتی کە پێی دەڵێن ئاسرەوان یان ئاگرەوان دەبێت بچێت لە هیندستان بخوێنێت ، ئەگەر زمانی ئاڤێستا بە کوردی و هەورامی بوایە ، دەبوایە لە هیندستانەوە بهاتنایە بۆ هەورامان و کوردوستان ، نەک لێرەوە بچیت بۆ ئەوێ ، ئەم کتێبە شوێنکەوتووانی زەردەشت نووسیویانەو پێک هاتووە لە کۆمەڵە دروشم و سرودو نووسینێک لە سەر عەقیدەو ژیانی زەردەشت و کۆکراوەتەوە لە سەدەی پێنجی زاینیداو ناویان لێ ناوە: < الأبستا > یان < الأفستا > ، ئاڤێستا بە زمانی فارسی واتە : < المتن أو النص الأصلی > = دەقی ئەسڵی . فارسەکانیش بە پێی بیروباوەڕیان کۆمەڵێک ڕاڤەو تەفسیریان بۆ داناوەو ناویان ناوە : < زند آفستا > واتە : شەرحی ئاڤێستا

.

✳ئاڤێستا چەند بەشە؟

وەک خۆیان دەڵێن ئەم کتێبی ئاڤێستا < پێنج > بەشەو هەندێک < گاتاکان >بە جیا لە < یەسنا > دادەنێن و بە شەش بەش حیسابی دەکەن . هەر بۆیە ئەگەر بە شەش بەش حیسابی بکەین < گاتاکانیش > دەبن بە بەشیک و دەکاتە شەش بەش بەڵام ئێمە لێرە باسی پێنج بەش دەکەین:

📌 بەشــی یەکەم : پێـی دەڵـێن : < یەسـنا > کـە لـە **72** بـەش پێک هـاتووەو بە دەقەکـانی دەڵـێن : < گاتـا > وەک دەڵـێن ئـەم <گاتایانـە>ش زەردەشـت خـۆی نوسـیوویەتی ، کەواتە لێـرە درۆی ئەوانە ئاشـکرا دەبێـت کە دەڵـێن : ئاڤێسـتا کتێبـی ئاسـمانییەو زەردەشـت خـۆی ، ئـەم **72** بەشـەش بناغـەی ئـایینی زەردەشـتییە بـۆ خـودا ناسـی و لای زەردەشـتییەکان ، زەردەشـت خـوای دروسـتی کـردووەو یاسـا و ڕێسـای بـۆ دانـاوە بـە شـێوەی هەڵبەسـت ، کەواتە < یەسـنا > کە لە **72** بەش پێکهـاتووە ئـایەت و بەڵـگە نیـیەو لە لایەن خـواوە یـان ئـاهورامەزداوە بـۆ زەردەشـت نەهـاتووە ، هەر بـۆیە جاروبـار عەلمـانیە زەردەشـتیەکان دەڵـێن : خـوداو ئایینەکـان مـرۆڤ دروسـتی کـردوون ، ئەمەش لەوێـوە سـەرچاوەی گرتـووەو وا دەزانـن هەمـوو ئایینەکـان وەک ئایینی زەردەشتی پینەو پەڕۆن......!!!

📌 بەشـی دووەم : پێـی دەڵـێن : < ڤیسـپەرد > ئەم بەشـە بـریتییە لەو هەڵبەسـتانەی لەبـارەی یەزدان و گـواسـتنەوەی دەسـتەواژەکان لە < یەسـنا >وە کە خـۆی لە بیسـت و سـێ پرۆسـەدا دەبینێـتەوە ، واتە هەڵبەسـتەکانی زەردەشـت بـۆ خـودا بیسـت و سـێ دانەیەو خـودا بـۆ زەردەشتی گوتووە ، نەک خودا بۆ زەردەشت ، بە ڕاستی سەیرە......!!!

📌 بەشـی سـێیەم : پێـی دەڵـێن : < یەشـت = یەشـتەکان > پـارانەوەو شـێوەن کە تـێکڵاویەکە لە هەڵبەسـت و پیاهەڵـدان و لاوانـدنەوە لە بـارەی خوداکـانی ئارایـایی ، کە دواتـر هـاتنە نـاو ئـایینی زەردەشـتی یەوە و ڕەنـگ و بـۆی زەردەشـتیان بە خۆیـان گـرت ، ژمـارەی < یشـت >کـان بیسـت و یەکەو هەر یەشـتێکیش لە بـارەی ، یەزدانە کە < یشـت > بە نـاوی ئەوەوە

ڕێکخراوەو ناو نراوە ، ئەم بەشانە لە بارەی ئاهورامەزداوە نییەو شیوەن و پارانەوەیە بۆ خواکانیتر ، کەواتە زەردەشتیەکان کاتێک دەڵێن ئایینی زەردەشتی ، ئایینی یەکتاپەرەستییە درۆ دەکەن ، لە هەمووی سەیرو سەمەرەتر ئەوەیە دەڵێن ئەم بیست و یەک یەشتە دواتر هاتونەتە ناوی ئایینی زەردەشتی ، ئێمەش دەپرسین : ئەگەر دەزانن ئەم بیست و یەک بەشە تەحریفەو گۆڕاوەو هاتووەتە ناو ئاڤێستاوە ، ئەی بۆچی لای نابەن؟!!!

📌 بەشی چوارەم : پێی دەڵێن : < وردە ئاڤێستا >: ئەم کتێبە لە سەردەمی شاپوری دووەم پاشای ساسانی ٣١٠ بۆ ٣٧٩ زایینی ، لە سەر بنەمای ئاڤێستای گەورە نوسراوە و بریتییە لە نزاو پاڕانەوە بۆ ئەنجامدانی نەریتی ئایینی ، نوێژ کردن و هەڵبژاردنی جەژنەکان ، ئەم بەشە وەک خۆیان دەڵێن زۆر گرنگەو بنەمای ئایینەکەیانە ، کەچی دوای زەردەشت نووسراوە ، ئێمەش دەپرسین : ئایا بەڵگەتان هەیە لە سەر بنەمای ئاڤێستای گەورە نووسراوە؟

📌 بەشی پێنجەم : پێی دەڵێن : < ڤەندیدا یان ڤەندیداد یان ڤێند ڤیداد > یاسای دژی خێو – دێو دەقی ئەم کتێبە بە گشتی بریتییە لە حکومە شەرعیەکان و تەفسیر و نەریتی نیەت پاکیەتی و پاکیزەیی و هاوشێوەکانی، لە فەلسەفەی بنچینەیی ئاینی زەردەشتەوە دوورە ، ئەگەر بە جوانی تێڕامان لەم بەشەو لە بەشەکانیتر بکەین بە جوانی درۆو مەهزەلەی زەردەشتیمان بۆ دەر دەکەوێت ، وەک ووتمان بەشی پێنجەم پێکهاتووە لە فقەو حوکمە شەرعیەکان لە بنەماو بنچینەی ئایینی زەردەشتییەوە دورە . کەواتە کتێبەکەیان هیچ یاسا و حوکمێکی شەرعی تێدا نیە . بەشی سێیەم و پێنجەمی کتێبی ئاڤێستا لە ئایینی زەردەشتییەوە دورە . بەشی چوارەم دوای زەردەشت نووسراوە ، کەواتە سێ

بەشـــی ئاڤێســـتا لە پێـــنج بەشـــەکە تەواو نـــیەو دەکرێـــت بڵێـــین بە ڕۆژی ڕوونـــاک ئەو ســـێ بەشـــەی ئاڤێســـتا ڕاســـت نـــیەو وەک ڕۆژی ڕوونـــاک ڕوونە ، دەمێنێـــــتەوە ئەو دوو بەشـــــەکەی ، دڵنیـــــابن ئەو دوو بەشـــــەکەش هەر بە دەردی ســـێ بەشـــەکە دەڕۆن و ڕاســـت نـــین و دواتـــر بە چـــاوی خۆتـــان دەیبینن.....!!!

ئـــایینی زەردەشـــتی یەکێکـــە لـــەو ئاینانـــەی کـــە لە ئێـــران و هیندوســـتان و پاکســـتان بـــوونی بـــووەو ئێســـتاش بە تـــاک و تەرا شـــوێنکەوتەی مـــاوەو بە ئـــایینی <الثنویـــة> دوو خـــواکە دادەنرێـــت ، لە بەر ئەوە وەک پێشـــتر باســـمان کرد باوەڕیان بە دوو خوا هەیە ، خوای خێرو خوای شەڕ.....

# ئایینی زەردەشتی

هەندێکیتر لە مێژوو نووسان دەڵێن : زەردەشت دانەری ئەم ئایینە بووەو زەردەشت کاتی خۆی < زەرادەشتی > کوڕی یورشیب بووەو لە ئازەربایجان لە دایک بووەو لە ساڵی **660**ی پێش زایینی . ئەم ئایینی زەردەشتییە کە بە ئایینی دوو خوایی ناودەبرێت . وەکو ئاینەکانی < المانوية و المزدكية > کە لە ناوچە فارسییەکان بوونیان هەبوو . وایە . لە بەر ئەوە زەردەشتیەکان باوەڕیان وایە ئەم دوو خوایە . واتە خودای خێرو شەڕ تاکو ڕۆژی دوایی ناکۆکیان هەیەو لە ئەنجامدا خودای خێر کە < ئاهورمزدا >یە بە سەر خوای شەر کە < ئەهریمن >ە سەرکەوتن بە دەست دێنێت و خودای شەڕ شکست دەخوات....

زەردەشت و زەردەشتیەکان خۆرو ئاگر دەپەرەستن و ئاگر بە سەرچاوەیەکی سەرەکی دادەنێن . ئاگرو خۆر بە دوو ڕەمزی مادی دادەنێن و بۆ خوای خێر کە عەقڵ ناتوانێت پەی ببات . خۆر لە ئاسمان ڕۆحی خوای خێر دەنوێنێت بە شێوەیەک کە خەڵکی دەتوانن ببینن . کە ئەمیش (خۆر) دروستکراوێکی درەوشاوەیە و خێر و چاکە بە سەر هەموو دروستکراوەکانی تر بەڵاو دەکاتەوە و هێز و چالاکیان پێ دەبەخشێت . بەڵام ئاگر سەرچاوەکە ڕۆڵی هێزی بەرز و بڵند دەنوێنێت . لای زەردەشتیەکان و باوەڕی زەردەشتیەکان وایە ڕوو دەکەنە هەموو ڕووناکیەک بە ڕۆژ ڕوو دەکەنە خۆرو بە شەو ڕوو دەکەنە مانگ و ئەستێرەکان و هەرچی شەوق و ڕووناکی هەبێت . گرنگ لای ئەوان ئەوەیە هەرچی ڕووناکی هەبێت بە پیرۆزو بەرزو بڵەندی دەزانن و رووی تێدەکەن . ڕوو تێکردنیش وەک ڕووگە وایەو ئەوان یەک ڕووگەیان نییەو چەندین ڕووگەی جۆراوجۆریان هەیە. لای زەردەشتیەکان ئاگر ڕێزو نرخی تایبەتی هەیەو زۆر گرنگ و پێویستە کە پیاوانی ئاینی زەردەشتی هەمیشە ئاگر لە ماڵەکانیان داگیرساو بێت . دەبێت لە کاتی داگیرسانی ئاگرەکە دەم و

لوتیـان هەڵبەسـتن بـۆ ئەوەی ئـاگرەکە پـیس نەبێـت و بە پیـرۆزی بمێنێـتەوە . زەردەشـتیەکان بە ڕێـزەوە دەچـنە ئەو جێگـایە کە ئـاگری تێـدایەو دەبێـت پـێش چـوونە ژورەوە خۆیـان بشـۆرن و پێڵاوەکانیـان دابکەنـن و دواتـر بچـنە ژوری ئـاگرەکەو دواتـر نـوێژ لە لای ئـاگرەکە دەخـۆێنن بە زمـانی غاسـای کـۆن کە دڵنیـام خۆشـیان واتـاکەی نـازانن و نـازانن چـیەو چـۆنەو لە کوێـوە هـاتووەو بۆ چیە.....!!!

لێـرە دەبێـت هەمـوو کەسـێکی واقیـع بـین بزانێـت کە ئـایینی زەردەشـتی ئـایینی ئاسـمانی نـیەو زەردەشـت پێغەمـبەر نەبـووەو ئاڤێسـتا کتێبـی ئاسـمانی نەبـووە . لە بەر ئەوە هـیچ بەڵـگەیەک نـیە بیسـەلمێنێت کە زەردەشـت پێغەمـبەر بـووەو کتێبـی ئاسـمانی بـۆ هـاتووە تەنـانەت لە کتێـبەکەی خۆیانیشـدا هـیچ بەڵـگەیەک نـیە . بـاوەڕ بـوون بە دوو خـوا دەیسـەلمێنێت کە ئـایینی ئاسـمانی نـیەو دروسـتکراوو دەستهەڵوەسـە . سـەرجەم ئـایینە ئاسـمانیەکان و بـانگەوازی سـەرجەم پێغەمـبەران یەکخواپەرەسـتی بـووەو پەرەستشـی تەنیـا الـلە بـووە وەک دەفەرمووێت:[وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ.....] النحل:٣٦

دواتـر دەبێـت ئەوە بـزانین ئەو کـات کە ئـایینی زەردەشـتی بە زۆر سـەپێنراوە بە سـەر کـورداو دواتـر بە ڕەغـبەت و ئـارەزۆو خۆشـحاڵییەوە ئیسـلامی وەر گـرت . لە بەر ئەوە ئەگەر خۆمـان لە مێـژوو هەڵە نـاکەین و بە جـوانی سـەرنجی مێـژوو بـدەین . زەردەشـتی ئـایینی دەوڵەتـی فارسـی ساسـانی بـووەو ئەو کـات کـورد وەک نەتەوەیەکـی ژێـر دەسـتی دەسـەڵاتی فـارس ئەو ئـایینەی بە سـەردا سـەپێنراوەو بە ناچـاری وەری گرتـووە . ئەوانەی بە جـوانی لە مێـژوو شـارەزان دەزانـن کە کـورد پـێش لە ئیسـلام خـاوەنی سـەربەخۆیی و خـاک نەبـووە . لە ڕووی سیاسـی و ئـابوری و کـۆمەڵایەتی و ئـایینیەوە . بەردەوام لە ژێـر دەسـەڵاتی فـارس و ڕۆمـدا بـووەو ناچـار بـووە ئـایین و فەرهەنـگ و کلتـوری ئەوان وەر بگرێـت . ئەوەی حەز لە ڕاسـتی بکـات و

کتێبی < محمد امین زەکی > مێژوونووسی گەورەی کوردی خوێندبێتەوە ئەم ڕاستیانەی تێدا باسکردووە.....

زۆربەی کتێبە مێژووییەکان باسی ئەوە دەکەن و ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن کە ئایینی زەردەشتی ئایینێکی کۆنی فارسی بووەو بە هیچ شێوەیەک ئایینی کوردو کوردی نەبووەو بە زۆر سەپێنراوە بە سەر کورددا . ئەم ئایینە لە سەردەمی کۆنەوە لە لایەن فارسەکانەوە گۆڕانکاری بە سەردا هاتووەو لە ئاینێکی ڕۆحییەوە گۆڕیان بۆ ئاینێکی پڕ لە ماددەگەری.....و.......

سەرمان سوڕ دەمێنێت سەرجەم کتێبە مێژووییەکان باسی ئەوە دەکەن کە نە زەردەشت کورد بووەو نە ئایینی زەردەشتی کوردیەو نە ئایینی زەردەشتی بە ئایینە ئەسڵەکەی ماوەو لەم ئاخیرەوە هەندێک کوردی گەمژە و حۆل و حەپۆل پەیدا بوونە بانگەشەی زەردەشتییەت دەکەن و تازە بە تازە دەیانەوێت فەرەنجیە دڕاوەکەی زەردەشت بکەن بە قاتی کوردی و جامانەی بۆ ببەستنەوە.....!!!

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە دەڵێن : ئایینی زەردەشتی هەڵگری ئەم سێ دروشمەیە :

- ☜ وتەی چاک
- ☜ بیری چاک
- ☜ کرداری چاک

بەڵام ئەمە تەنیا خەڵەتانەو بەس . دەزانن بۆ؟

لە بەر ئەوە ئەگەر تەماشای خودی ئاڤێستا بکەین ئەم چەواشەو خەڵەتانەمان بۆ دەر دەکەوێت . هەر لە خودی ئاڤێستادا هاتووەو دەڵێت : ئەوەی سەر بە ئایینی زەردەشتی نەبێت دێو و درنجە . بۆ دڵنیابوون تەماشای ئەم دەقانە بکەن:

< گاتا 34 بەندی 9 >

> گاتا 30 بەندی 6 >

ئایا دەزانن زەردەشت بە کێ وتوویەتی دێو؟

بەو کەسانەی کە لە سەر ئایینی زەردەشتی نەبوون ، بۆ زیاتر دڵنیابوون تەماشای: > لە گاتا 30 بەندی 6 >بکە.

ئایا ئەوە وتەی چاکە کە زەردەشت بەوانەی لە سەر ئایینی زەردشتی نین ، بڵێ دێو و درنج؟!!

کەواتە زەردەشتیەکان کاتێک باسی وتەی چاک و بیری چاک و کرداری چاک دەکەن درۆ دەکەن و دواتر بە دەیان بەڵگە بۆتان دەیسەلمێنین............

بۆ بە درۆخستنەوەی ئەو دروشمە درۆینە نموونەیەک لە سەر بیری چاک دێنینەوە:

ئایینی زەردەشتی دەڵێت ئاگر مرۆڤ ناسوتێنێت ، کێ هەیە باوەڕ بەم درۆ و چەواشەیە بکات؟

من لە سەرجەم زەردەشتیەکان دەپرسم ئایا ئەمە بیری چاکەو ئاگر مرۆڤ ناسوتێنێت؟

ئەگەر دەڵێن : ئاگر مرۆڤ ناسوتێنێت و ئێمە باوەڕمان بەو بیری چاکە هەیە ، وەرە با تاقی بکەینەوە؟

لەوانەیە هەندێک کەس باوەڕ نەکات و بڵێت شتی وا شێتانەو گەوجانە لە ئایینی زەردەشتیدا نیە ، ئێمەش دەڵێن : ئەگەر گومانیت هەبوو سەردانی ئەم دەقە بکە:

> ڤیندداد فەرگەدی 5 دەقی 9 >

نموونەیەک  لە بیرو کردارە چاکەکانی ئایینی زەردەشتی:

کێ باوەڕ دەکات لە ئایینی زەردەشتیدا کچ پێش لەوەی بچێتە لای مێردەکەی دەبێت سێکس لە گەڵ باوکی بکات؟

ئەگەر باوەرت نەکرد سەردانی ئێرە بکە:

< دینکرد کتێبی نۆیەم بەشی 67 >

کەواتە وتەی چاک و بیری چاک و کرداری چاک لە ئاینی زەردەشتیدا درۆیەو خەڵکیان گەوجاندووەو خۆیان گونجاندووە بۆ مەبەست و ئامانجی خۆیان ، ئێستاش ئەوانەی بانگەشەی زەردەشتییەت دەکەن کەسانێکی فاشل و دۆڕاون هەمو هەرسێکیان هێناوەو دەیانەوێت بەو شێوەیە هەندێک کوردی گەمژەو کۆیلە فریو بدەن........

لە ئایینی زەردەشتیدا باوک دەتوانێت کچی خۆی بێنێت و پیاو دەتوانێت ژنی خۆی بفرۆشێت ، بەڵام نازانم بە کام عەقڵێکەوە زەردەشتیەکان دەیانەوێت بیشارنەوەو حاشای لێ بکەن؟!!!

زەواج کردنی مەحرەم لە ئایینی زەردەشتیدا هاتووە ، واتە :

⚠ کچ دەتوانێت زەواج لە گەڵ باوکدا بکات

⚠ خوشک دەتوانێت زەواج لە گەڵ برادا بکات

⚠ دایک دەتوانێت زەواج لە گەڵ کوڕدا بکات

ئەوەی جێگای پێکەنیە ئەو دەقانە لە بەڵگەو بەڵگەنامە مێژوویی و دەقە ئایینی و ئەو کتێبانەی زەردەشتیەکان خۆیان نووسیویانە کە ئاوێسایەو ئەو سەرچاوانەی کە لای خۆیان جێگای باوەڕو زۆربەی بە پەهلەوی نووسراوەو ماوەیەکی زۆر ، بگرە بە سەدان ساڵ باوەڕی پێکراوەو جێبەجێکراوە ، ئێستا دەیانەوێت پەنکوێرو پەردەپۆشی بکەن و شەرم دەکەن و دەیشارنەوە ، بەڵام ئایا بەم خۆ گێلکردنە بۆیان دەچێتە سەر؟

ئەم نووسین و بەڵگانە ، ناشارێتەوەو بەڵگەی مێژوویەو لە ئایینی زەردەشتیدا ئانجامدراوەو پەیڕەو کراوە ، کەواتە نابێت ئەو شتانە بە کەم دابنرێت و بە ئاسانی حاشای لێ بکرێت و هەوڵی پەردەپۆشکردنی بدرێت

،لە بەر ئەوە هەر لە کونەوە ئەم شتە باسکراوەو سەرجەم ئایین و نەتەوەکان باسیان کردووەو بووتە شایەت بە سەریانەوەو زەردەشتی بەو شتانە ناسراوەو باسکراوە ، ئێمە نارۆین لە ئایین و نەتەوەکانیتر باسی ئەم پرسە بکەین ، هەر لە خودی ئایینی زەردەشتیدا بە بەڵگە دەیسەلمێنین کە ڕاستەو ئایینەکەیان ڕێگەی بەو شتانە داوە....وەک زەواجی مەحرەم کە دواتر لە < زەواجی مەحرەم بە زمانی ئاوێستا > باسی دەکەین....

## زەواجی مەحرەم بە زمانی ئاوێستا:< khvêtûdâdŏ >

زەواجـی مەحـرەم لە ئـاینی زەردەشـتیدا بـووە بـە تایبـەت لـە سـەردەمی ساسـانیەکان و دوای ئـەوانیش بـە زور شـێوەو شـێواز و مەبەسـت ئـەنجام دراوە...

کتێبـی <دینکـەرت> کـە کتێبێکـی کـۆن و گەورەیـە لـە لایـەن دەسـتورانی ئاینی زەردەشـتی نوسـراوە بـە زمـانی پەهلـەوی و ئـەو نوسـخەی ئێسـتا باسـی دەکەیـن هـی دەسـتور پێشـتون سـەنجانا ( Peshotun Dastoor Behramjee Sanjana ، کـە زانـاو دەسـتوری زەردەشـتیەکان بـو لـە کـاتی خـۆی و ئـەم نوسـخەیە لـە لایـەن: (Ratanshah E. Kohiyar) تەرجـومە کـراوە بـۆ سـەر زمـانی ئینگلیـزی و بە درێـژی باسـی هاوسـەرگیری محـاریم دەکات . ئێمە لێرەدا بە کورتی تەنیا دەقێک باس دەکەین:

> دینکەرت پەرتوکی 3 بەشی 80 <:

ئێمە لێرە باسی ئەو سێ جۆرە زەواجە دەکەین کە بریتییە لە :

یەکەم : زەواجی باوک و کچ ⚠

دووەم : زەواجی کورو دایک ⚠

سێیەم : زەواجی خوشک و برا ⚠

**three kinds. of these one is that of father and daughter, the second is that of son and mother, and the, third is that of brother and sister...**

ئەگەر بە جوانی دڵنیا نەبووی . فەرموو ئەمە لینکی دەقەکەیە:

**http://www.avesta.org/denkard/dk3s80.html**

به کــورتی  لــەم بەشــەی دینکــەرت دا دەســتورانی ئــاینی زەردەشــتی باســی ئەو جورە زەواجــە دەکــەن بــە درێــژی و لــە لایــان شــتێکی ئاســایی‌ە و تێدا نــاوی ویتــودا (Khwetodas ) هــاتووە کــە مەبەســت ئــەم جــورە زەواجەیــەو دواتــر باسی جۆرەکانیتر دەکات .........

بــە پێــی دەقــەکانی ئــاینی زەردەشــتی یەکــەم زەواج لــە نێــوان دوو خوشــک و بــرا بــوو ماشــای (Mashyâîh ) و ماشــایو(Mashyâyôîh ) ودواتــر لــەم دوو خوشک و برایە منداڵ بووە.....

پــەرتوکی زەردەشــتی بــە پەهلــەوی ناســراو بــە ( دادســتانی دینــک ( Dâdistân_î Dînîk.

لە : < بەشی 65 دەقی 1_2 >:

1) پرســیار و وەڵامــی شەســت و چــوار. کــە ووتــی: کــەی و لــە چــی بونــەوەر گەشــەکردوە. وکــەی زەواجــی نزیکــەکان ( مــەحرەم) هــەبوو. و لــە چ شوێنێک؟

لە وەڵامــی پرســیاری شەســت و چــوار دەڵێــت : یەکــەم زەواجــی نزیکــەکان لــە نێوان ماشای و ماشــایو بــوو کــە خوشــک و بــرای یــەکتر بــوون و لە نێوانیانــدا کورێک بووەو  زەواجەکەیان یەکەم زەواجی نزیکەکان بوو

لینکی دەقەکە:

http://www.avesta.org/mp/dd42.htm#chap65

پوختەی ئەم خاڵە ئەوەیە:

ئــەم دەقــە بەڵگەیــە کــە مەبەســت لــە وشــەی زەواجــی نزیکــەکان next_of_kin marriage (khvêtûdâdŏ) زەواجکــردن لــە گــەل مــەحرەمە ، و ئــەم دەقــە زەواجــی برایــە لــە گــەل خوشــک کــە بەڵگەیــە لــە ســەر هــەبوونی ئــەم جــورە زەواجــە و شــتێکی ناســراوە لــە نــاو ئــەوان . زەرەشــتیەکان خویــان ئــەم شــتەیان نوســیوە نــەک ئــاینێکی تــر یــان ســەرچاوەیەکی غــەیری زەردەشــتی

باسی کردبێت ، ئەمە لە پەرتوکێکی زەردەشتی پەهلەوی دا یە ، کەچی ئەگەر ئەم دەقە لای زەردەشتیەکان پیروزیش نەبێت و بلێن باوەرمان پێی نیە ، بەڵگەیەکی مادی و مێژوویە کە ئەم شتە لە ئاینی زەردەشتی هەبووە و ئەم جورە پەرتوکە لە کاتی خویدا پەیڕەوکراوە.

هەمان شت لە پەرتوکی بونداهێش **Bundahis** دا هاتووە کە ئەویش پەرتوکێکی کۆنی زەدەشتی یە بە زمانی پەهلەوی نوسراوە:

لە: > بەشی **15** دەقی **22ـ 24** >:

**24)** لە ئەوان حەوت جوت پەیدا بوون نێر و مێ و هەر برایێک لە گەڵ خوشکێک و هەمویان لە گەڵ یەکتر بو ماوەی پەنجا ساڵ. منالّ پەدابوون و مردن لە دوای سەد ساڵ

لینکی دەقەکە:

**http://www.avesta.org/mp/bundahis.html#chapter15**

دەبێت کچ یەکەم جار بچێتە لای باوکی خوی دواتر بچێتە لای مێردەکەی...!!!

دەقێک لە پەرتوکی دینکرت بوتان نەقڵ دەکەین کە زەردەشتیەکان خویان ئەم پەرتوکەیان نوسیوە و ئەگەر لە لای زەردەشتیەکانمان پیروزییش نەبێت وەکو بەڵگەیەکەی مێژووی حساب دەکرێت کە لەو کاتەدا پێش ئەوەی کچ بچێتە لای پیاوی خوی دەبێت بچێتە لای باوکی خۆی بو ئەوەی فێری ڕەفتارکردن ببێت لە گەل مێردەکەی....

> دینکرد **9** بەشی **67** دەقی **7ـ9** >:

**7)** هەروەها. کچ دەیدەن بە باوکی وەکو کچێک ، بو ئەم هۆیە ، چونکە لە لای فێری تەحەمول دەبێت وەکو کچێک لە لای.

هەروەها دەسەڵاتی خوهومان لە لایەن وەرگێراوە کە بەهرەی چاکەکاری دەپیارێزێت، بۆ ئەم هۆیە، چونکە دەسەڵاتی چاکە و قازانج و ئازادی هەڵدەستێنت لە ناکۆکی زانست.

هەروەها، کچ دەدرێتە باوکی بۆ خزمەتی ژنانە (وەکو ژن)، و هەروەها دەبێتە ژنی کەسێکی تر، بو ئەوەی فێری ڕێزگرتن ببێت، بەرامبەر بە باوک و مێردەکەی، و بو کچەکە و ژنێکی تر، و ئەوەی ژنی پیاوێک فێردەکات وەکو کەیبانوو، چونکە قازانجی خزمەتی ژنانەی ژنەکە بۆ پیاو چاکەکاری هەڵدەستێنت بەرامبەر بە مێردەکەی خۆی و مەشق کردنێکی باشە.

لینکی دەقەکە:

http://www.avesta.org/denkard/dk9sbe58.html#chap67

لەدەقی **7** دا کچ وەکو هەر کچێک لە لای باوکی خۆیەوە فێری ڕەوشت دەبێت بەڵام لە دەقی **9** دا کچ وەکو ژن لە لای باوکی خۆیەوەو باوکی دەبێتە مێردی...

پوختەی ئەم خاڵە ئەوەیە:

زەواجی کچ لە گەڵ باوک کە جورێکە لە زەواجی مەحرەم و زەرەشتیەکان خویان ئەم شتەیان نوسیوە نەک ئاینێکیتر یان سەرچاوەیەکی غەیری زەردەشتی باسی کردبێت ، ئەمە لە پەرتوکێکی زەردەشتی پەهلەوی دایە...

ئایزانم لەوانەیە هەندێک زەردەشتی مودێرنەو سەردەم بڵێن ئەوە کتێبە کۆنەکانی زەردەشتی باسی ئەو شێوە زەواجە دەکەن و ئێمەی زەردەشتی ئێستا باوەڕمان بەو دەقانە نیەو پەیڕەوی ئەو دەقانە ناکەین ، ئێمەش دەڵێین : ئەم زەواجە لە ئایینی زەردەشتدا هەیەو بوونی هەبووەو خودی زەردەشت زەواجی لە گەڵ کچی خۆیدا کردووە ، ئەم زەواجی مەحرەمە ئەوە نیە تەنیا لە ئایینی زەردەشتیدا بوونی هەبێت و ئەنجام درابێت بەڵکو خودی زەردەشت لە گەڵ کچی خۆیدا کردوویەتی ، ئیتر بە کام دەق

و بەڵــــگە زەردەشــــــتی مــــۆدێرنەو ســــــەردەم لە بەر عەیـــــبەو سەرشـــــۆڕی ڕەدی دەکاتەوەو پەنکوێری دەکات�!!!

لە : > یەسنا هاتی 53 دەقی 4 <دا هاتووە

( بــــەڵێ مــــن بــــە دڵ گــــەرمی ( پــــوروە چیســــت ) بــــۆ کــــردەوەی دینــــی ڕێنــــوێنی دەکــــەم هــــەتاکو بــــاوک و شــــووەرزیەران و ئازادەگــــان لــــەو کــــە پاکــــدینی، پاکدینانە خۆشحاڵ بن... )

ئەمــە بــە گــوێرەی وەرگێڕانەکــەی عومــەر فــارووقی .. کــە زور ڕوون نیــە چونکــە لــە دەقــی وەرگێــڕاوی فارســی وەریگێــڕاوە بویــە ئنگلیزیەکــەتان بــۆ نــەقڵ دەکــەین و وەردەگێــڕین . لە بەر ئەوە بــە ڕاســتەوخۆ لــە دەقــی ئاوێســتای وەرگێڕاوە :

( (جاماســپ): بــە دڵ گــەرمی ڕێنمــایی (پــوروە چیســت) دەکــەم بــو بــاوەری، کــە خزمەتی باوک و مێردی خوی بکات و جوتیار و پیاوی خانەدان... )

وەرگێڕاوە ئنگلیزیەکەی (L. H. Mills) ساڵی 1898

(Jamaspa): Earnestly will I lead her to the Faith, that she may serve her father and her husband, the farmers and the nobles, as a righteous woman (serving) the righteous. The glorious heritage of Good Thought ... shall Mazda Ahura give to her for all time.

لینکی دەقەکە:

http://www.avesta.org/yasna/index.html#y53

لێرەدا چ خزمەتێکە بو باوک و مێردی خوی دەکات...!!

لە پەرتوکی زەدەشتی ساسانی دا وەکو تەفسیرێک بو ئەم دەقە هاتووە:

> دینکرت 9 بەشی 45 دەقی 4 <

